# پێشەکی

سەرەتا دەمەوێ سوپاسی خودای گەورەو باڵادەست بکەم کە توانیم کتێبەکەم تەواو بکەم دوای هەوڵ و ماندوبونێکی زۆر بۆ ئەوەی بتوانم سودێک بگەیەنم ئەم کتێبە پێشکەشە بە گەنجانی وڵاتەکەم وە ئەزیزانم هیوام وایە بتوانم سودێکی بچوکتان پێ بگەینم هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو لایەک دەخوزازم.

٩.٩.٢٠٢٠

ڕۆژی چوارشەممە

زەیتون إسماعیل ئیبراهیم

# سەرەتا

سەرەتا دەمەوێ باسێکی کورتی خۆم بکەم من کەسێک بووم خەون و ئامانجێکی وام نەبوو لە ژیان ڕۆژەکانم هەر بەشتی بێسوود بەسەر دەبرد هەموو ڕۆژێکم هەر دووبارە و دووبارە بوو هیچ شتێکی نوێ نەبوو لە ژیانم وە زۆر رقیشم لە کتێب خوێندنەوە بوو بەڵام دوای ئەوەی کە پشوو دەستی پێکرد بەهۆی نەخۆشی کۆرۆنا کاتی کەرەنتین ئەوکات لە پەیمانگا بووم لەم پشووە هەستم بە بونی خۆم کرد وای کرد کە خەون و ئامانج و پلان دابنێم لەم پشووە ویستم هاوڕێیەک بدۆزمەوە تا هەمیشە لام بێت دۆزیمەوە بوم بەهاوڕێی کتێب سەرەتا دەستم کرد بە خوێندنەوەی کتێب وام کرد هەموو خولیایەکم بچێتە سەر خوێندنەوە تا وام لێهات ئاشقی کتێب بووم ئەو رقەی کتێب نەما لە ناخم کتێب بوو بەبەشێک لە ژیانی رۆژانەم تا وام لێهات خەونی ئەوەم هەبوو کتێبێك بنوسم بەناوی خۆم وە ئێستاش دەستم کرد بە نوسینی کتێبەکەم تا بتوانم سودێك بگەیەنم بە خوێنەران لەژێر ناونیشانی "سەرکەوتنی تۆ " بۆیە ئەم ناوەم هەڵبژارد چونکە زۆرێك لە گەنجەکانمان هیچ ئامانج و خەون و پلانیان نییە لە ژیاندا زۆر بێ هیواو بێ ئومێد بوونە هەتا بەخۆشمەوە وابوم بۆیە من بەتۆ دەڵێم هەستە خۆت بدۆزەوە تواناکانت بەهاکانت بدۆزەوە گرینگی تۆ بێ هودە نەهاتیتە دوونیا بەتایبەتی لەم وەزحەی ئێستادا وە ئەمەش چەند وشەیەکی سودبەخشی تێدایە هانی گەنجەکان دەدا تاکو بتوانی خەون و ئامانجی هەبێ لەژیان ، ژیان بەبونی ئامانج جوانە بەهیوای سود بینین و سەرکەوتن بۆ هەموو لایک.

# باوەربەخۆبوون

یەکەم خاڵی سەرکەوتن باوەربەخۆبونە سەرەتای دەستپێکردنی هەرکارێک پێویستە باوەرت بەوە هەبێ کە تۆ دەتوانی ئەم کارە بکەی ئاساییە با شکست بێنی لە کارەکە دوای هەر شکستێک هەڵسانەوە هەیە دووبارە دەست پێکردنەوە هەیە گرنگ ئەوەیە تۆ وازنەهێنی، تۆ کۆڵنەدەی، تەنها لەبەرئەوەی شکستت هێنا وازدەهێنی !!ئێ بۆچی؟ نا زۆر هەڵەی دەبێ هێزی باوەربەخۆبون لە ناخت هەبی هەرگیز کۆڵنەدەی چونکە ئەوە خەونی تۆیە، ئامانجی تۆیە، سەرکەوتنی تۆیە ...بەڵێ تۆ دەتوانی ئەوە بکەی هەوڵی ئەوە بدە لە ژیاندا سەرکەوتوو بیت گەرچی بناغەی سەرکەوتنەکان تێپەرینی ناخۆشی و سەختیە بەڵام لە هەمووی گرنگتر متمانە بەخۆبووونە.

# خۆتبە

هەمیشە ببە بەخۆت مەبە بە ئەوان ئەوەبکە کە ناخی خۆت دەیەوێ نەک ئەوەی خەڵکی دەیەوێ.

# هەڵە

ئێمەی مرۆڤ هەرگیز ناتوانین بێ کەموکوری بین مەحاڵە کەسێک هەبێ هیچ کەموکوری نەبێ.

تەنانەت ئادەم و حەواش هەڵەیان کردیە کە ئەوان یەکەمین مرۆڤ بوون لەسەر زەوی چۆن تۆ لەو باوەڕەدایت کە بێ کەموکوری بیت.

هەڵەکان بەشێکن لە تاقیکردنەوە ، بەشێکن لە ئەزمون و فێربوون تەنانەت لەوانەیە هەڵەیەک تەواوی ژیانت و بیرکردنەوەت بگۆڕێت هەڵەکان بۆ ئەوەدروست بوون تا ڕێنیشاندەرمان بێت بەڵام وامەکە هەڵەکان بتروخێنن و خۆت زیندانی بکەی لە هەڵەکانتەوە فێربە بەڵام سەرزەنشتی خۆت مەکە لە کۆتاییدا تۆمرۆڤیت.

# بیگۆڕە

ئەگەر دەتەوێ ژیانت بگۆڕی ئەوا بیرکردنەوەت بگۆڕە.

لە ڕێگەی بیرکردنەوەکانمان چارەنوسمان دەگۆڕێ ئێمە بەرهەمی بیرکردنەوەی خۆمانین.

# مەحاڵ

مەحاڵ چییە؟

لە راستی دا مەحاڵ هیچ پێناسەیەکی نییە چونکە هەرخۆی وشەیەکی هیچەهیچ شتێك مەحاڵ نیە ئەگەر تۆ ئێستا دەڵێی ئەوا ژینگەو کۆمەڵگە وای کردوە کە من نەتوانم بیکەم مەحاڵە نا وانیە چونکە گەر تۆ بەپەرۆش بیت بۆ ئەو شتەی دەتەوێ پێی بگەی ئەوا هیچ شتێ کارت لێ ناکا و رێگر نییە بەس ئەوە خۆتی مەحاڵت لە مێشکت چەقاندووە وشەی مەحاڵ دەرکە لە مێشکت.

# مرۆڤ بونەوەرێکی سەیرە

مرۆڤەکان ئاسایی نین هیچ شتێك ناتوانێت جێی مرۆڤ بگرێتەوە مرۆڤەکان توانایان هەیە لە هەموو شتێك کارەبایان دروست کردوە، فرۆکەیان دروست کردوە ، سەیارەیان دروست کردوە جۆرەها شتی تریان دروست کردوە کێ ئەو بەهرەیەی پێداون بێگومان خودا خودا وای کردوە تاقەیەکی وای هەبێ خوای گەورە مرۆڤی دروست کردوە بۆ ئەوەی ئاسمان و زەوی ئاوەدان بکەنەوە.

خودای گەورە خۆی لە قورئان دەفەرموێت: ئێمە مرۆڤمان لە باشترین شێوە دروست کردوە لەخۆت کەم مەکەرەوە تۆ بۆ ئەوە دروست بویت تا بەرەنگاری خۆت بیتەوە بەرەنگاری هەموو سەختی و ناخۆشیەکان بیەوە بەرەنگاری تاقیکردنەوەکانی خودا بیەوە کەواتە تۆ مرۆڤیت دەبێ بەرگەی هەموو شتێك بگری لە ژیاندا.

# ژیان

ژیان پەلکەزێرینە نیە, هەندێ جار ژیان هێندە بەقورسی روبەروت دەبێتەوە دەتخاتە سەر ئەژنۆکانت, بەڵام تۆ دەبێ بەرگەی هەموو ئازارو شکست و کەوتنەکان بگری بۆ ئەوەی بگەی بەوشتەی کە شایەنتە سەرکەوتن ئەوەیە کە تۆ روبەروی هەموو ئازارەکان بیتەوە لەپێناو ئەوەی تۆ دەتەوێ.

گەر تۆ بارانت دەوێ دەبی بەرگەی هەورە بروسکەش بگری سەرکەوتنیش وایە گەر دەتەوێ دەبێ بەرگەی شکستەکانیش بگری.

# کات

رۆبن شارما دەڵێ: کات وەك دەنکۆڵەی لم لە دەستمان دەروات ، هەرگیز ناگەڕێتەوە ئەوانەی کات بە دانایی بەکاردێنن پاداشتەکەیان ژیانێکی دەوڵەمەند و پڕ  بەرهەم و ڕەزامەندە.

# ئارامگرتن

ئەگەر تۆ دەتەوێ بگەی بە ئامانجەکەت ئەوا ئارامبگرە,  خەڵك شکست دەهێنن چونکە هەموو شتێکیان خێرا دەوێ, ئارامناگرن ئێ کەوایە تۆش ئارامبگرە چونکە سەرکەوتنە مەزنەکان کاتی پێویستە.

شەونخونی پێویستە  کەوایە پەلەت نەبێ لە بەدەست هێنانی رۆژێك دێت پێی دەگەی چونکە ئارامتگرتووە.

# ئامۆژگاری بلیۆنەرەکان

" بەهەرزانی بژی "

مەبەستی ئەوەیە پارە مەدە بە شتی بێبەها

**مارك كوبان**

" سەرکێشی ئەنجامبدە "

**ئیلۆن مەسك**

" هەتا زووە ببە بە بەروبەری خۆت "

**بێل گەیتس**

# هیلاکی

هیلاکی تۆ هیلاکی

دەزانم ژیان عەزابی داوی

دەزانم دڵت شکاوە

دەزانم ئازارت هەیە

دەزانم سەدەها خەم لە ناخت هەیە

دەزانمماندویت لە ژیان

ئەوانە هەموی دەزانم بەڵام تۆ بۆچی لێرەی؟کاری تۆ چییە ؟ بۆ ئەوە هاتوی دەست بەرداری خەون و ئامانجەکەت بی لەبەر ئەوەی پێیان گوتی ناتوانی, بەڵام هەموو ئەو ئازارو خەمانەن تۆ پێدەگەیەنن ئەو ئازارانەن بەهێزت دەکەن دەتگەیەنن بەوەی دەتەوێ چرۆکی کەسە سەرکەوتوەکان ئەوەیە کە رابردویەکی بە ئازاریان هەبوە تا گەیشتون بە ئامانجەکانیان ئەوانەن هەنگاوی گەورە بەتۆ دێنن بیرت نەچێت

شکار عبداللە

# سەرکەوتن

سەرکەوتن گەیشتن نیە سەرکەوتن گەشتە

گەیشتن لەگەڵ گەشت جیایە

سەرکەوتن دڵێکی ئارامە

سەرکەوتن کۆڵنەدانە

لەسەر ئەوشتەی کە دەتەوێ

لەسەر ئەو شتەی هەوڵی بۆ دەدەی

ئەوە سەرکەوتنە تۆ کاتێ گەیشتی نەوەستی

گەیشتن بۆتۆ کۆتایی نییە

سەرکەوتن نوقتە توقتەیە بەڵام کۆتایی نییە

نوقتەیەك دێتە پێش پێی دەگەیت

بەڵام خەونێکی گەورەترت بۆ دروست دەبێ

ئەگەر دروست نەبێ ئەوە سەرکەوتن نییە

چاك بزانە ئەوە سەرکەوتن نییە

شکار عبدالله

# دەزانی تۆ بۆچی نیگەرانی؟

چونکە تۆ بەدوای شتێکەوەی کەهیتۆ نییە وە شتێکت ئیهمال کردووە کە هیتۆیە..!

چونکە گرینگی بە کەسانێك دەدەی کە تۆیان لا گرینگ نییە, چونکە بەدوای کەسانێکەوەی کە سودی بۆت نیە, چونکە کاتت بۆ کەسانێك تەرخانکردووە کەچی ئەوان کاتیان نییە بۆت تۆ هێشتاش ئامادەی نرخ و بەهای خۆت لەدەست بدەی بۆ ئەوەی ئەوان تۆیان بەدڵ بێت.

تەنانەت ئامادەی دەست بەرداری سەرجەم خەونەکانت بیت تەنها بۆ ئەوەی تۆیان بەدڵ بێت, تا کەی دەوروبەرمان بە گرنگ بزانین لەخۆمان کاتی ئەوە نەهاتوە ئاوڕێك لەخۆمان بدەینەوە .کاتی ئەوە نەهاتوە بەدوای خەونەکانمان برۆین لەمەودوا خەونەکانمان بە گرنگ بزانین لە قسەو قسەلۆکی خەڵکی با رازی دڵی خۆمان بخەینە پێش رازی کردنی دڵی خەڵکیەوە با نیگەرانی کەسانێک نەبین کە باکیان بە ئێمە نییە ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە ئاورێك لەخۆمان بدەینەوە با تا ئێرە بەس بێت.

# خودا

بیرت نەچێ تۆ خودایەکت هەیە لە خۆشی و ناخۆشی لەگەڵتە هەرکاتێك بتەوێ قسەی لەگەڵ بکەی گوێت بۆ دەگرێ جا خۆشیەکەی لەوەیە خودا چیرۆکی ژیانت هەموو دەزانێ کەچی هەر گوێشت بۆ دەگرێ بۆیە هەرکاتێك ناخۆشی هاتە رێت ئەوە بێ هیوا مەبە چونکە دڵنیابە ئەوە حیکمەتێکی تێدایە خودا خۆی باشتر دەزانێ چی بۆت باشە.

خودا دڵخۆشت دەکا بەڵام لەوانەیە کەسێك بکاتە دڵخۆشیت یان شتێك بۆیە نائومێدمەبە هەرگیز مەوەستە لە دوعاکردن خودا وەڵامت دەداتەوە لە کاتێکدا کە خۆشت باوەرت پێی نەبێ بەڵێ خودا.

# بپرسە!!!

لەخۆت بپرسە من کێم ؟

لەخۆت بپرسە بزانە بۆچی لێرەی ؟

لەخۆت بپرسە ئامانجت چییە لە ژیان ؟

لەخۆت بپرسە لەچ شتێکا بەهرەت هەیە ؟

لەخۆت بپرسە بۆچی دەژی دڵت چی دەوێ ؟

بیرت فراوان بکە تا وەڵام ئەم پرسیارانە بدەیتەوە خۆت بدۆزەوە تا وەڵام ئەوانەت دەست نەکوێ نازانی چیت پێویستە لە ژیان ئامانجت چییە بۆچی لێرەی یەکەمین پرسیار گرنگە بزانی تۆ کێی؟ خۆت بدۆزەوە گرنگترین ئەو پرسیارانەی کە تۆ پێویستە وەڵامەکانی بزانی.

# شکست

شکست ئەوە نیە کە تۆ جارێك کەوتی ئیتر بڵێی تەواو من ناتوانم ئەنجامی بدەم نا ئەوە نیە.

شکست ئەوەیە گەر تۆ جارێك کەوتی ئەوا تۆ دەجار هەستەوە بەهێزێکی زیاتر و فێربونێکی زیاتر بەیەکەم هەنگاو سەرکەوتوو نابی دەکەوی ، دەشکێی ، بێ هیوادەبی ، ئازار دەچێژی بەڵام کەسی سەرکەوتوو دوای هەموو ئەوانە هێزێکی زیاتر دروست دەبێ لەناخی بە ئەزمونێکی زیاتر دەستپێبکەوەو دەستپێبکە.

# خۆتت خۆشبوێت

یەکەمجار خۆتت خۆشبوێ چونکە خۆت ئەو کەسەی هەموو ژیانت لەگەڵی دەبەیەسەر .خۆتت خۆشبوێت و لە کاتە ناخۆشەکان پشت لەخۆت مەکە چاوەڕێی یارمەتی لەدەستی کەس مەکە خۆت بجەنگە روبەروی کێشەکان ببەوە ، روبەروی شکستەکان بەوە ، پێویستە خۆت خۆشبویٚ رێز لەخۆت بگرە پێش ئەوەی هیچ کەسێکی ترت خۆشبویٚ.

# وازبێنە

وازبێنە لە وتنی وشەی من ناتوانم

وازبێنە لە سەرزەنشتکردنی خۆت

وازبێنە لە بەکارهێنانی وشە نێگەتیڤەکان

وازبێنە لەوەی خۆت بەکەم بزانی

وازبێنە لە رابردوو

وازبێنە لە هەموو ئەو شتانەی نارەحەتت دەکەن

وازبێنە لەو کەسانەی زیانی هەیە بۆت

وازبێنە لەو کەسانەی دایم وشەی نێگەتیڤ بەکاردێنن

وازبێنە ، وازبێنە ، وازبێنە ...بەسە ئیتر برۆ بەدوای ناخی خۆت بکەوە وازبێنە لە خەمخواردن ئەوەندەی بەدیار خەم دادەنیشی برۆ بە دوای ئامانجەکەت ئەوا سەرکەوتوو دەبی وازبێنە لە هەموو ئەوانە.

# خەون

پەندێکی سویدی هەیە دەڵێ:  خودا کرمی داوەتە هەموو چۆلەکەیەك بەڵام فرێی نەداوەتە هێلانەکانیان.

دەی تۆش وایت خودا خەون و ئامانجی خستۆتە مێشکت بەڵام نەك ئەوەی کە بەبێ هەوڵدان خەونەکە خۆی بێتەدی پێویستت بە هەوڵ و ماندووبونە بۆ ئەوەی خودا کارەکەت ئاسان بکا.

ژیان فێری کردووم کە پێوانەی سەرکەوتن بەو مەکانەتانە ناکرێ کە کەسێك پێی گەیشتووە لە ژیان بەڵکو بەو بەربەستانەیە پێوانە دەکرێ کە بەسەریان زاڵ بووە لەکاتی هەوڵدان بۆ سەرکەوتن.

**" بوکەر واشنتۆن "**

# هیوا

جوانترین شت له مرۆڤدا بونی هەبێ هیوا بونه بەژیان تۆی مرۆڤ بۆ ئەوه نەبووی تا بێ هیوا بیت، تا بێهێز بی، تا خۆت لەدەست بدەی نا تۆ بۆ ئەوه نەبووی بەڵکو تۆی مرۆڤ دەبێ بەهێز بی دەبێ هیوات هەبێ بەهەر شتێك له ژیان چونکه بێ هیوا بونت ناتگەیەنێ بەهیچ کوێ جگه له ئازاردانی ناخی خۆت دەی کەوایه تۆ بۆچی خۆت نیگەران دەکەی خۆت ئازار دەدەی خۆت لەباوەش بگره بڵێ شانازیت کپێ دەکەم خۆمی ئازیز تا ئێرەت هێناوه.

# بەخۆت بڵێ

بەخۆت بڵێ هەموو شتەکانی خۆم خۆشدەوێ باشیم ، میهرەبانیم ، دڵتەنگیم ،دڵسۆزیم، هەر شتێکی خۆت بڵێ و بیکە بزانە چ دڵخۆشت دەکا ئەنجامی بدە هەمیشە با هۆکارێك هەبێ بۆ دڵخۆشیت تۆی مرۆڤ دڵتەنگی ، شکاوی ، ئازاردراوی ، بەڵام دوای ئەو هەموو شتە هۆکارێك هەیە یان کەسێك یان شتێک کە دڵخۆشت دەکا هیچ شکستێك و هیچ خەمێك تا کۆتایی نییە دڵنیابە رۆژێك دێت تێدەگەی ئەو شکستەی تۆ حیکمەیێکی تێدابووە دەی کەوایە ئێستا بەخۆت بڵێ خۆشمدەوێ.

# تۆ

هێی تۆ شتێکت پێ دەڵێم

تۆ زۆر بەهێزی

تۆ دەگەی بە ئامانجەکەت

# ژیان کورتە

بەفیرۆی مەدە بەخەمباربوون ، گەشبین بە ، بەئومێدبە ، دڵخۆشبە ، ئازادبە ، هەرچیەك دەتەوێ بە کاری چاکەت خۆشبوێ باشبە خۆشەویستی ببەخشە چونکە ئێمە بۆ هەمیشە لێرە نابین چی لە ناخت دایە ئەنجامی بدە گوێ بە ئەولاولا مەدە خۆت چیت پێ باشە بیکە خۆت مەگۆرە لەبەرئەوان باش و میهرەبان بە خودا لەبیری ناکا دڵنیابە چیت بەخشی ئەوە دێتەوە ڕێت ژیان ئەوە ناهێنێ دانیشی دانە بە دانەی خەمەکانت بژمێری خۆت ئازار بدەی ژیان کورتە دەی تاکو هەی بەخۆشی ببەسەر خۆت نیگەران مەکە خەون و ئامانجت هەبێ بەدوای دا برۆ دڵنیابە تێیدا سەرکەوتوو دەبی دەگەی بە لوتکەی سەرکەوتن.

سەرکەوتن وەك ماددەی بێهۆشکەر وایە ، یەکجار بەدەستت هێنا ئارەزوی بەدەستهێنانی زیاتر دەکەی.

# دەست پێبکە

دەست بکە بەو ئامانجەی لە مێشکت دایە برۆ بە دوای چاوەڕێی چی دەکەی بۆچی دەست پێ ناکەی؟ بەهانەت چییە؟ چاوەڕێی ئەوە دەکەی کەسێك دەستن بگرێت بۆ ئەوەی بگەی بە خەونەکەت چاوەڕێی هیچ شتێك لەکەس مەکە ئەوە خۆتی دەتوانی ژیانت بگۆری ، دەتوای بگەی بە خەونەکەت ، دەتوانی سەرکەوتوو بیت ، دەتوانی ئەنجامی بدەی ئەگەر دەتەوێ سەرکەوتوو بیت چیتر کات بەفیرۆ مەدە دەست پێبکە.

**تۆ بەنرخی**

**تۆ ئازای**

**تۆ بوێری**

**تۆ گرنگیت**

**تۆ ئاقلی**

**تۆ باشی**

**تۆ جوانی**

**تۆ سەرکەوتووی**

**تۆ دڵ پاکی**

**تۆ ئەژی**

**تۆ بەردەوامبە**

**تۆبەهێزی**

**تۆ دەتوانیت**

**بەڵێ تۆ تۆ دەڵێم**

# خەندە

هەمیشە با زەردەخەنە لەسەر لێوانت بێت بەرامبەر بە خەڵکی رق و کینە لە دڵت دەرکە رووخۆش بە پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت روخۆشیت بەرامبەر براکەت چاکەیە.

# دڵنیابە

دڵنیابە وەختێك دەشكێیت ، جگە لەخۆت كەسیتر بنیادن نانێتەوە ، وەختێكیش شكست دەخۆی جگە لە ئیرادە و متمانە بەخۆبونت ناتوانێت سەركەوتنت پێ ببەخشێت ، هێزی وەستان جارێكی تر جگە لەخۆت كەسیتر نیەتی بۆتۆ ، لەچاوانی ئەوانی تر بۆ نرخ و بەهای خۆت وێڵ مەبە ، بەڵكو لە ویژدانتدا بە دوای بگەرێ ، هەروەختێك ویژدانت ئارامبوو ، شكۆت باڵا دەبێت ...وەختێكیش خۆت خۆتت ناسی ، وتی ئەوانی تر دەربارەی تۆ زیانت پێ ناگەیەنن**..!**

**د .محمود موعەزەمی**

# بەردەوامبە

بەردەوامبە لە هەوڵدان مەوەستە تا ئێرەت هێناوە بەتەمای بگەڕێیتەوە؟ بەردەوامبە لە کۆشش کردن تا دەگەی بە لوتکە بەردەوامبە لە ئەنجامدانی ئامانجەکەت نائومێد مەبە لەوەی کەسێك پێی وتی ناتوانی تەنها وازمەهێنە ئاساییە با شکست بێنی ، ئاساییە با بکەویئاساییە با بلێن ناتوانی ، ئاساییە با قسەبکەن تەنها ئەوەی ئاسایی نییە تۆ کۆڵ بدەی هەرگیز کۆڵمەدە بەردوامی دەتگەیەنێت بە ئامانجەکەت.

تۆ ناتوانی بەدڵی هەمووان بیت هەمووان لەخۆت رازی بکەیت بۆیە بەدوای ناخی خۆت بکەوە خۆتت قبوڵ بێت.

# بەڵێن بەخۆت بدە

بەهێز بمێنی کە هیچ شتێ نەتوانێ ئازاری مێشکت بدات بەڵێن بدە تۆ دەتوانی بگەی بە خەونەکەت بەڵێن بدە کەس نەتوانێ ئامانج و خەونەکەت لە مێشکت دەرکا ئەوانەی پێت دەڵێن ناتوانی ئەوا خۆیان ئاستی ئەوەیان نییە بگەن بەتۆ بۆیە دەیانەوێ ئامانجکەت لە مێشکت دەربکەن بۆیە تۆ بەرپەچیان بدەوە بڵێ دەتوانم بەڵێ تۆ دەتوانی چونکە بەڵێنت بەخۆت داوە.

# بینوسە

هێی تۆ دەڵێم نازانم تۆ کێی کاتێ ئەم نوسینە دەخوێنیتەوە .وە نازانم چی لەناخت هەیە، نازانم ئامانجت چییە ، نازانم چیت پێویستە لە ژیان.

من هیچ لەوانە نازانم بەڵام با شتێکت پێ بڵێم هەڵستە قەڵەم و وەرەقەیەك بێنە برۆ شوێنێکی چۆڵ تەنها بیربکەوە قەڵەم و وەرەقەت هێنا ؟ لەسەر ئەم وەرەقەیەی بەردەمت هەرچی لەناختە بینوسە بەنوسین دەتوانی بگەی بەوەی دەتەوێ بەشوێنێکی هەلواسە هەموو رۆژ بیبینی هەرچی ئامانجێکت هەیە بینوسە با بچوکرین شتیش بێت ئامانجەکەت هەر بینوسە چونکە تا لەشتی بچوک دەست پێ نەکەی ناگەی بە گەورەترن ئامانج.

تۆ ئێستا هەموو شتێکت نوسی لەسەر ئەم وەرەقەی بەردەمت کەواتە چاوەڕێ چی دەکەی هەر ئەمرۆ دەست پێبکە بە ئەنجامدانی دەست پێبکە دڵنیات دەکەمەوە سەردەکەوی ئەمرۆت لەدەست مەدە دەستت پێ کرد من خودی خۆم بەنوسین دەستم پێکرد دلنیام سودی دەبێت بۆتۆش.

# بەوهیوایەم

بەو هیوایەم تێبگەی هەموو شکستێك مانای لاوازی نییە

بەوهیوایەم تێبگەی هەموو هەڵەیەك مانای ئەوە نییە مرۆڤێکی کەمتەرخەمی

بەوهیوایەم رابردوو وەك وانەیەك و ئەزمونێك سەیر بکەی

بەوهیوایەم ژیان لەخۆت ئاڵۆزنەکەی

بەوهیوایەم خۆت لەدەست نەدەی

بەو هیوایەم بگەی بە ئامانجەکەت

بەو هیوایەم دەست بکەی بە ئەوەی ناخت دەیەوێ

# دەرفەت

ئەو دەرفەتە لە دەست مەدە کە دێتە پێشت بۆ ئەوەی دەست پێبکەی ئەوە تاکە هەلی تۆیە تاکە ئامانجی تۆیە شتی کەمت پێ بچوك نەبێ ئەو هەلانەن دەبێتە دەستپێکی ژیانی تۆ تاوەکو بیقۆزیتەوە بۆ شتی گەورەترو سەکەوتنی مەزنتر.

# بجەنگە

بجەنگە لە پێناو خەونەکەت و ئامانجەکەت چونکە ئەوە ئاواتی تۆیە دەبێ بەرەنگاری هەموو ئەو ئازارو شکست و ناخۆشیانە بیتەوە لە پێناوی دا تا پێی دەگەی رێگای سەخت دەبری بەڵام کە پێی گەیشتی نازانی چەندە دڵخۆش دەبی بەڵێ بجەنگە وازنەهێنی چاوت لەسەر ئامانجەکەت بێت.

**هونەری دڵخۆش بوون رازی بیت بەوەی هەتە رازی بی بە هەموو ئازار، ناخۆشی شکست**

**هەموو ئەو شتە بەنرخانەی پێت بەخشراوە بەڵێ رازی بە ...**

# فێربە

کەسە نەرێنیەکان لە ژیانت دەربکە ئەو کەسانەی هەمیشە سەرزەنشتت دەکەن فێربە لێیان بەدووربی ئەو کەسانەی کە پشگیریت ناکەن دەیانەوێ شکستی تۆ ببینن وازیان لێبێنە.

# هەندێ کات

هەندێ کات پێویستە بکەوی بۆ ئەوەی بەهێزێکی زیاتر دەستپێبکەیەوە کەوتن مانای لاوازی نییە بەڵکو مانای کۆڵنەدانە مانای بەردەوامبونە لە ئامانجەکەت.

هەندێ کات پێویستە دوور لە هەموو شتێك بیت دور لەژاوەژاوی دونیا سەرێك بدەی لە تەنهایی.

هەندێ کات پێویستە برۆی بەناو دونیای سروشت  دەرونت ئارام بکەیەوە تۆ مرۆڤی ناوە ناوە پێویستت بە پشووە.

**گەر مرۆڤ ئامانجی نەبێ لە ژیان وەك ئامێرێ لە كاركەوتوو وایە**

# بوەستە لە شکانی خۆت

بوەستە لە گرینگی دان بە شتانێك گرینگ نین

بوەستە لە زۆر خەوتن

بوەستە لە بەفیرۆدانی ژیانت

بوەستە لە بەفیرۆدانی کاتت

دەست بکە بە خەون و ئامانجەکانت هەوڵی بۆ بدە گرینگترین شت هەوڵدانە پێی دەگەی دڵنیابە.

# هەرگیز کۆڵ مەدە

دەمەوێ باسی نمونەی کەسێک بکەم...

ئەویش لەزاری جاک ما خۆیەوە "هەرگیز کۆڵ مەدە" یەکێکەلە هەرە بەناوبانگترین دروشمەکانی جاک ماو ئەم دروشمەش دەنگدانەوەی کۆڵنەدانی خۆیەتی وە راهاتنیەتی لەهەموو ئەو رەتکردنەوانەی کە وەریگرتووە لە ژیانیدا ، و بەتایبەتی لە بواری کاردا بەجۆرێک کە داوای کاری لە ٣٠ شوێنی جیاوازا کردووە بۆ وەرگیرانی وەک پۆلیس و لە ٥ کەس یان ٤ کەس وەرگیران ئەو تاکە کەس بوو کە وەرنەگیرا جاک ما بوو، هاتە چین ٢٤ کەس داوای کاریان پێشکەش KFC وە کاتێک زنجیرە رێستورانتی نێودەوڵەتی کرد و ٢٣ کەس وەرگیران ئەو تاکە کەس وەرنەگیرا جاک ما بوو.

دووجار لە تاقیکردنەوەی وەرگرتن لە زانکۆ شکستی هێناوە ١٠. جار داواکاری خوێندنی پێشکەشی زانکۆی هارڤارد کردووە هەر ١٠ جار رەتکراوەتەوە هەر بۆیەش جاک ما پێیوایە یەکێک لە نهێنیەکانی سەرکەوتن لێراهاتنە لە وەرنەگرتن و رەتکردنەوە ، چیرۆکی ژیانی جاک ما گواستنەوەیەکی راستەقینەیە لە سفرەوە بەرەو لوتکە ئەو پیاوەی لەهیچ کوێ کاری پێنەدەدرا ئێستا یەکەمین بەرێوبەری جێبەجێکاری چین و هەموو ئاسیایە کە وێنەکەی لە رووبەری یەکەمی گۆڤاری فۆربس دەرکەوت بێت، ئێستا چیرۆکی ئەو پیاوەتان زانی چی لێ فێربویت؟هەرگیز کۆڵ نەدەی ئەو پیاوە ئەوەندە جارە شکستی هێنا کەچی هێشتا وازی نەهێنا کۆڵی نەدا کە بە شکستەکان بروخێ بەڵکو شکستەکان وای کرد بەرزتر بێت و بەهێزتر بێت دەی تۆش بەیەک شکست واز دێنی! نا دووبارە دەست پێبکەوە فێربە با شکستەکان نەتروخێنن لەجیاتی ئەوەی دانیشی بەدیار شکستەکانت خەم بخۆی برۆ دووبارە هەوڵبدەوە سەردەکەوی کۆڵ مەدە.

# سوپاس گوزاربە

قەدری ئەو شتانە بزانە کە هەتە سوپاس گوزاربە ئەوەی هەتە وە ئەوەشی لەدەستت داوە نرخی سات بە ساتی ژیانت بزانە سوپاسی هەموو شتێک بکە کە هەیە لە ژیانت وەڵاهی جارێکیان چوم بۆ نەخۆشخانە پیاوێکم بینی کە لەسەر عارەبانە بوو ناڵەناڵی بوو لەبەر ئازاری قاچی ئەوکاتە زانیم لەشساغیم چ نیحمەتێکی جوانە کە خوا پێی بەخشیوم زۆر سوپاس گوزارم  ئەوە بزانە ناشوکر مەبە بەوەی بلێی لوتم زلە ، لێوم بچوکە ، باڵام کورتە ...هتد

قەدری ئەوە بگرە کە هەتە  ژیان گەشتێکی کورتە .

دەی کەوایە تۆش ئازادی، ەندروستیت باشە هێشتا لە ژیانی کات درەنگ نییە دەست پێبکە بە ئامانجەکەت لەبەرچی دەست پیَ ناکەی بەهانەت چیە؟

چاوەرێی چی دەکەیت تەنها هەنگاوێک برۆپێشەوە هێزی متمانە خۆی دروست دەبیَ.

پێویسته تیبگەین  هەموو شتێک بەبێ مەبەست روونادا ئازارەکان ، دڵ شکان ، ناخۆشی  شکست...

هەموو ئەوانە زیاتریش کە روبەرومان دەبێتەوە مەبەستێکی خۆی تێدایە لەوانەی ئەو شتە روینەدابا

ئەوا تۆ توشی شتی گەورەتر بوبایتەوە بۆیە هیچ کات مەڵێ بۆچی من تێبگە لەو مەبەستە ئەوە

هەمووی ئاگادارکردنەوەیە بۆ ئەوەی گۆڕانکاری لەخۆماندا بکەین.

## ٢٢ ئامۆژگاری بێڵ گەیتس

- ✓ چواردەورت پڕ بکە لەو کەسانەی کە کێبڕکێت لەگەڵ دەکەن
- ✓ متمانەت بەوە هەبێ کە جیهان باشتر دەبێ
- ✓ گەشبینی دەتوانێ تا دورت ببات
- ✓ هەمیشە زۆر پرسیار بکە
- ✓ بۆ هەر ئیشێک دەتەوێ بکەیت زوو دەست پێ بکە
- ✓ کاری هاوبەش لەگەڵ خەڵکدا بکە
- ✓ لە کاردا ئەوەندەی ئەموون پێویستە قوتابخانە پێویست نیە
- ✓ هەر زوو ببە سەر کاری خۆت
- ✓ بۆ هەڵەکانت مەگری لێیانەوە فێربە
- ✓ هەم بە دڵ و هەم بە ئەقڵیش کاربکە

- ✓ ژیان باشترین قوتابخانەیە نەک زانکۆ و کۆلێژ
- ✓ لەبەرامبەر گەمژەکان نەرمو نیان بە
- ✓ تەلەڤزیۆن ژیانی ڕاستەقینە نیە
- ✓ ژیان دادپەروەرانە نیە
- ✓ ئامادەبە بۆ ریسک و خۆخستنە مەترسیەوە
- ✓ هەرگیز لە ڕێگای سەرکەوتن پەلە مەکە
- ✓ شانازی بەخۆتەوەبکە
- ✓ هەموو کات سادەو بێ فیزبە
- ✓ شتەکان ئەرێنیانە وەربگرە
- ✓ با حەزت بە فێربوون بێت
- ✓ شکستەکانت قبوڵ بکەو بەردەوامبە
- ✓ سەرکەوتنەکانیشت لەگەڵ هەمووان بەش بکە

## ئۆپرا وینفری

## ململانێی چارەنوسێکی رەش

لەوانەیە زۆرێکمان ئەم ئافرەتە بناسین ناویمان بیستبێ چیرۆکی ئەم ئافرەتە لێرەوە دەست پێدەکات ئۆپرا لە کارەکەی وەک بێژەر دەرکرا لەبەرئەوە بەشێوەی راستەوخۆ لە کاتی پەخشدا گریا کاتێک ئۆپرا لە دایک بوو دایکی تەنها هەرزەکارێکی شونەکردوو بوو ئۆپرا بە هەژاریەک گەورە بوو هەنێکجار لەبری جلوبەرگ کیسی پەتاتەی لەبەر دەکرد لەبەر ئەو هۆکارەش"ئۆپرا" توشی چەندین شێوازی گاڵتەپێکردن و سوکایەتیەک بوو بۆیە بریاری دا رووبکاتە گوندەکان و هاورێیەتی لەگەڵ ئاژەڵەکان دروستکرد لەبری مرۆڤ دایکی رۆژانە چەندین سەعات بەردەوام وەك پاککەرەوەیەک کاری دەکرد زۆینەی جار ئۆپرای بەتەنها لەماڵ جێدەهێشت هەرچەندە ئۆپرا لە خوێندن دا زۆر زیرەک بوو ، بەڵام ژیانی ماڵەکەی رۆژ لەدوای رۆژ خراپتر دەبوو بەشێوەیەک کاتێک تەمەنی بوە ٩ ساڵ لەلایەن زۆرێک لە خزمەکان توشی ئازاردان بۆوە پاش چەندین ساڵ لە چەرمەسەری ئۆپرا لە ماڵەکەی هەڵهات لە کاتێکدا تەمەنی تەنها ٤ ساڵ بوو دواتر لەئەنجامی دەستدرێژی کردنە سەری ئۆپرا سکی پر بوو بەڵام منداڵەکەی بەمردووی١ لەدایک بوو ئۆپرا پاش ئەو هەموو ناخۆشیە کە بەسەری هات بریاری دا تەسلیم نەبێ بەڵکو ژیانی بگۆرێ بۆ باشتر بۆیە لەهەموو کات زیاتر سەرنجی خستە سەر خوێندنەکەی توانی ئۆفەری زانکۆ بەدەست بهێنێت پاش ئەوەی لە پێشبرکێی رەوانبێژی سەرکەوتوو بوو .پاشان توانی نازناوی شاجوانی ناوخۆیی بەدەست بهێنێ ئینجا بەشێوەی نیو دەوام بوە پێشکەشکاری رادیۆیی دواتر ئۆپرا بووە گەنجترین پێشکەشکاری هەوالی کە کار لە تەلەڤزیۆنی ناوخۆییدا بکات...

بەڵام لەبەرئەوەی لەپەخشی راستەوخۆی هەواڵەکاندا چەند هەواڵێکی گاریگەرو ناخۆش وای لێکرد بگری بۆیە گواستیانەوە بۆ بەرنامەی بەیانیان سەرباری ئەوەی ئەو گواستنەوەی وەك پلە نزمکردنەوەیەک وابوو بەڵام بوە هۆی کرانەوەی بەختی بەجۆرێک رۆڵەکەی و کاریزمەکەی کە لەبەرنامەی بەیانیان دا بینی بووە هۆی درەوشانەوەو ناوبانگ دەرکردنی ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ببێتە یەکێک لەباشتریۆ پێشکەشکارەکان لەوکاتەدا هەروەها بەرنامەکەی بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ بەردەوامبوو کەسایەتیەکی بۆخۆی دروست کرد توانی کاریگەری سیاسیشی هەبێ ئۆپرا بووە یەکەم ژنە رەش پێست لە جیهاندا سامانەکەی بگاتە یەک ملیۆن دۆلار هەروەها توانی ١٨ خەڵاتی جیهانی بباتەوە وەك خەڵاتی ئیمی و ئۆسکار وەهەروەها توانی خەڵاتی ئازادی سەرۆکایەتی بباتەوە کە لەلایەن سەرۆکەوە دەبەخشرێت بەکەسایەتیە زۆر گرینگەکان لە ئێستادا ئۆپرا گۆڤارێکی تایبەت بەخۆی هەیە لەگەڵ ئێسگەیەکی تەلەڤزیۆنی و بەرنامەیەکی تایبەت بەناوی ئۆپرا سەرباری هەموو ئەمانە بەشداری لە بەخشینی سامانەکەی کردووە بۆ چەندین پرۆگرامی رۆشنبیری و فێرکاری گەشتی ژیانی ئۆپرا ئەوەمان پێ دەڵێت کە رێگای سەرکەوتن هەموو کات ئاسان نیە.

# لەچەند وتەیەکیدا ئۆپرا دەڵێت

ئەو کارانە بکە کەوا هەست دەکەی پێت ناکرێ شکست بهێنە پاشن هەوڵبدەرەوە ...!

ئەو کەسانەی هەرگیز نەکەوتون هەرگیز نەگەیشتون بەهێلی کۆتایی.

لەو بڕوایە دام ئەوەی ڕودەدات لەژیانماندا هۆکارێکی هەیە هەموو ئەزمونێک هەرچیەک بێت پەیامێک و کتێبێکە بۆ ئێمە پێویستە ئامادە بین بۆ خوێندنەوە .

وەئێستاش چیرۆکی ئەم ئافرەتەت زانی لەچیەوە بوو بەچی بۆیە پێت دەڵێم تۆش بەیەکەم شکست وازمەهێنە شکستەکان ئەزمونت پێ دەدەن و فێرت دەکەن دەتگەیەنن بەوەی دەتەوێ ئەگەر لە ژیان هیچ هەلەیەکت نەکرد هیچ کێشەت نەبوو ئەوا بزانە ریگاکەت هەڵەیە بۆیە هەرگیز کۆڵ مەدە دووبارەو دووبارە دەست پێبکەرەوە.

کات بەفیڕۆ مەدە بە بیرکردنەوە لە دوێنێ ، ساڵێک پێش ئێستا ، مانگێک، هەفتەیەک چونکە هیچی ناگۆڕێ تەنها بیرکردنەوەت تێکدەدا ئازارت دەدا واز بینە بابڕوا ناگەڕێتەوە.

گرنگ ئێستاتە ئێستات گەشاوە بکەیت هێزی ئێستات بەکاربینە ئەوەی ڕۆشت بڵێ خوات لەگەڵ وانەیەکی جێهێت ئەوە گرنگە تەمام.

# كۆتـــــــــايی

**وە لە كۆتاییدا سوپاس تا ئێرە لەگەڵم بویت خوێنەری کتێبە خنجیلانەکەم بوویت هیوام وایە گەر گۆڕانکاریەکی بچوکیش بێت لە خۆتا کردبێت.**

**٩.٩.٢٠٢٠**

**"زەیتون ئیسماعیل ئیبراهیم"**